


# زیکرەکانی قورئان



ئامادەکردنی:
دەستەی ئەندامانی ڕۆشناییی قورئان

## بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أمابعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

پرۆژەی ئەمجارەمان ڕۆشنایی قورئان خۆی بە خۆشحاڵ دەزانێت کە جارێکی تر بە پڕۆژەی نوێوە دێتەوە خزمەتتان، بریتییە لەو زیکر و نزا و پاڕانەوانەی کە لە قورئاندا هاتوون و پێغەمبەران و پیاوچاکان بەم زیکر و دوعایانە لە خودای باڵادەست پاڕاونەتەوە، و بێگومان سەرفراز و

سەركەوتووە ئەو كەسەی ڕووی داوای لە خوا دەكات و هەمیشە دڵ و دەروون و زمانی تەڕە بەیاد و زیكری خودا.

لە خودا داواكارین لە ئێمە و ئێوەی قبووڵ بكات و بیكاتە مایەی توێشووی قیامەتمان و تەرازووی كردەوەی چاكەمانی پێ بەرز ببێتەوە، بمانبورن لە هەر كەموكوڕیەک كە لە پڕۆژەكانماندا هەبێت، بەدڵنیایی تەنیا خودا كامڵ و بێ كەم و كوڕییە.

﴿ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ٢٤ ﴾ القصص، پەروەردیگـــارا، بەڕاستـی تۆ خێـر و بێـری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵـــام هێشتـا هـەژارم و موحتـاجی بەخششـی زیـاترم.

# فەزڵ و گەورەیی زیکر

خودای پەروەردگار دەفەرموویت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ ﴾ الأحزاب، (ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناو، یاد و زیکری خودا بکەن بە یاد و زیکرێکی زۆر).

وە دەفەرموویت: ﴿ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێبووردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە.

هەروەها ﷻ دەفەرموویت: ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَـٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: یادی پەروەردگارت لە دڵ و دەروونی خۆتدا بە لاڵانەوە و ترسەوە بکە، بێ دەنگ بەرزکردنەوە (لە نیوان چپە و ئاشکرادا)، لە بەیانیان و دەمەوئێواران، لە بێئاگایان مەبە (ئەوانەی دڵیان غافڵە).

سەروەر و نوری چاومان ﷺ لەبارەی دوعا و پاڕانەوە دەفەرموویت:

((إنَّ الدُّعَاءَ هُوَ العِبَادَةُ)). واتە: پاڕانەوە، خودی خوا پەرستییە.

(ئایە ئاگادارتان بکەمەوە بە باشترینی کردەوەکان و پاکترینیان لە لای خودای پادشاتان و بەرزترینیان لە پلە و پایەدا و باشتر لە بەخشینی ئاڵتوون و زیو و باشتر لەوەی، کە بگەن بە دوژمنەکانتان و بدەن لە گەردنیان و ئەوانیش بدەن لە گەردنتان؟ هاوەڵان (ڕەزای خودایان لێبێت) فەرموویان: بەڵێ، دەمانەوێت بۆمانی باس بکەیت، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: بریتییە لە زیکرو و یاد کردنی خودای بەرزو بڵند).

((پیاوێک بە پێغەمبەری خودام ﷺ فەرموو: ئەی نێردراوی خودا بەڕاستی ئاین و شەریعەتی ئیسلام زۆر بوونە لەسەرم، شتێکم پێ بڵێ، کە ئیسلامی تێدا کۆببێتەوە، تا وەکو دەستی پێوە بگرم. پێغەمبەری خودا ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: با بەردەوام زمانت تەڕبێت بە زیکر و یادی خودا)).

هەر کەسێک دانیشتبێت لە کۆڕ و مەجلیسێکدا، کە یاد و زیکری خودای تێدا نەکرابێت، ئەوە بێگومان پەشیمانی بۆ دەمێنێتەوە، هەروەها هەر کەسێک پاڵکەوتبێت و یاد و زیکری خودای نەکردبێت ئەوە پەشیمانی و بەدبەختی بۆ دەمێنێتەوە.

یەکەم

## خودایە لە خەسارتمەندان نەبین

﴿...رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٢٣﴾ الأعراف.

(پەروەردگارا ئێمە ستەمیان لە خۆمان کرد، خۆ ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، ئەوە بەڕاستی ئێمە ـ سوێند بە خواـ لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانین).

دووەم

## پەروەردیگارا هەر بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە

﴿رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٤﴾ الممتحنة.

(پەروەردگارا، هەر پشتمان بە تۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە).

سێیەم

## پەروەردگارا شایەتی دەدەین بە وەحدانییەتی تۆ

﴿ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ آل عمران.

(پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەوەی داتبەزاندووە و ڕەوانەت کردووە، شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشتین، دەسا تۆش لە ڕیزی شایەتەکانی (گەیاندنی بەرنامەکەتدا) تۆمارمان بکە).

چوارەم

## پەروەردگارا لێمان خۆش بە و ڕەحمان پێ بکە

﴿ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾ المؤمنون.

(پەروەردگارا ئێمە ئیمان و باوەڕی دامەزراومان بە زاتی تۆ هێناوە، دەسا لێمان خۆش ببە و ڕەحممان پێ بکە، چونکە تۆ چاکترین زاتێکی کە لە هەموو خاوەن ڕەحم و سۆزەکان میهرەبانتریت).

پێنجەم

## خودایە لە نوێژ خوێنان بین

﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ٤٠ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ
وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ٤١﴾ إبراهيم.

(پەروەردگارا، خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی کە ئەنجامدەری نوێژ بین بە چاکی، پەروەردگارا، دوعا و نزام گیرا بکە. پەروەردگارا، لەخۆم و دایک و باوکم و ئیماندارا ن خۆش ببە، لەو ڕۆژەدا کە لێپرسینەوە بەرپا دەبێت).

شەشەم

## خودایە لە گوناهەکانمان خۆشبە

﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٦﴾ آل عمران.

(پەروەردگارا، بەڕاستی ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە، دەسا لە گوناهەکانمان خۆش ببە و لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە).

حەفتەم

## خودایە ڕوناکی سەر پردی سیراتمان زیاد بکە

﴿ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٨ ﴾ التحريم.

(پەروەردگارا ئەم نوور و ڕووناكییەمان بۆ زیاد بكە و لێمان خۆش ببە، چونكە بەڕاستی تۆ دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێكدا هەیە).

هەشتەم

## خودایە لە ئێمە و لە ئیماندارانی پێشینمان خۆشبە

﴿ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠ ﴾ الحشر.

(پەروەردگارا لە ئێمە و لەو برایانەشمان خۆش ببە كە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەكانماندا هیچ جۆرە بوغز و كینەیەک مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا تۆ بەڕاستی بەسۆز و بەخشندە و میهرەبانیت).

نۆیەم

# خودایە لە گومڕاکاران نەبین

﴿ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٥ ﴾ الممتحنة.

(پەروەردگارا مەمانکە بە مایەی گومڕایی بۆ ئەوانی بێ باوەڕ بوون، لێشما خۆش ببە پەروەردگارمان، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت).

﴿ رَبِّ فَلَا تَجۡعَلۡنِي فِي ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٩٤ ﴾ المؤمنون.

(پەروەردگارا مەمخەرە ڕیزی قەومی ستەمکارەوە).

﴿ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٧ ﴾ الأعراف.

(پەروەدگارا مەمانگێڕە لەگەڵ دەستەی ستەمکاراندا).

دەیەم

## خودایە کارەکانمان لێ وەرگرە

﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ
وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ ﴾ البقرة.

(پەروەردگارا ئەم کارەمان لێ وەربگرە و لە ڕیزی چاکەکانماندا تۆماری بکە، چونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی زۆر بیسەر و زانایت. بەروەردگارا، هەردووکمان وا لێ بکە تەنیا فەرمانبەردار و ملکەچی تۆبین و لە نەوەکانیشمان ئوممەتێکی موسڵمان و فەرمانبەردار بۆ خۆت فەراهەم بهێنە و چۆنیەتی ڕێبازی بەندایەتیمان فێربکە و نیشانمان بدەو تەوبە و پەشیمانیمان لێ وەربگرە، بێگومان تۆ خوایەکی زۆر تەوبە وەرگر و میهرەبان و دلۆڤانیت).

یازدەیەم

## خوایە نەبینە هۆکارێک بۆ خراپەکاری

﴿ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ یونس.

(پەروەردگارا مەمانگێڕە بەهۆکاری سەرگەردانی بۆ قەومی ستەمکاران (کە هەم ئێمە ئازار بدەن هەم خۆشیان گوناهبار ببن و دوور بکەونەوە لە ئیمان). هەروەها بە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت (دەرووی خێرمان لێ بکەرەوە) ڕزگارمان بکە لە دەست هۆز و دەستەی بێباوەڕان).

دوازدەیەم

## خودایە دامەزراومان بکە

﴿ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤٧ ﴾ آل عمران.

(پەروەردگارا لە گوناهـ و هەڵەکانمان ببورە و لە زیادەڕەوی کاروبارمان خۆش ببە، دامەزراومان بکە، سەرمان بخە بەسەر ئەم گەلە بێباوەڕەدا).

سێزدەیەم

## خودایە لە سۆز و میهرەیانی خۆت بەهرەوەرمان بکە

﴿ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا ١٠ ﴾ الكهف

(پەروەردگارا لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەت و میهرەبانی تایبەتیان پێ ببەخشە و لە سۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکە و ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا).

چواردەیەم

## پەروەردگارا نەوەی چاکەکارمان پێ ببەخشە

﴿رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ٧٤﴾ الفرقان.

(پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادومانی دڵمان و بمان کە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان).

پازدەیەم

## پەروەردگارا لە سزای ئاگری دۆزەخ بەدوورمان بکە

﴿رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ٦٥﴾ الفرقان.

(پەروەردگارا، لە سزای ئاگری دۆزەخ بەدوورمان بکە و پەنامان بدە، چونکە سزاو ئازاری لە کۆڵ نابێتەوە و بەردەوامە (بۆ ئەو کەسەی خوانەناس و یاخییە). بەڕاستی ئەو دۆزەخە شوێن و نیشتەجێیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە (ئاهو ناڵە و پەشیمانی بێسنوورە تیایدا).

شازدەیەم

## خودایە پەنات پێدەگرم لەداواکردنی ئەو شتانەی نایانزانم

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٤٧ ﴾ هود.

(پەروەردگارم، بەڕاستی من پەنا دەگرم بۆ تۆ کە داوای شتێك بکەم زانیاریم پێی نەبێت، خۆ ئەگەر لێم خۆش نەبیت و بەزەییت پێمدا نەیەتەوە ئەوە دەچمە ڕیزی خەسارەتمەندانەوە).

حەڤدەیەم

## خودایە لێمخۆشبە من لە ستەم کارانم

﴿ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ ﴾ الأنبياء.

(پەروەردگارا هیچ خوایەک نییە جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم، (کاتێک بە بێ فەرمانی تۆ قەومەکەم بەجێهێشت).

هەژدەیەم

## خودایە بمبورە من زووڵمم لە نەفسی خۆم کردووە

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ ﴾ القصص.

(پەروەردگارە من بەڕاستی ستەمم لە خۆم کرد، کاتێك لە دەستم دەرچوو ئەو کابرایەم کوشت، لێم ببوورە و بمبەخشە، جا خوای میهرەبانیش لێی خۆشبوو، بێگومان ئەو زاتێکی لێخۆشبوو میهرەبان).

نۆزدەیەم

## خودایە داوای کارێکمان لێ نەکەی کە لەتواناماندا نەبێت

﴿ ءَامَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ
بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ
نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا
تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا
وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلَانَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة

(پێغەمبەر و ئیماندارن باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی، (دەڵێن:) هیچ جۆرە جیاوازیەک ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکانی خوادا (لە باوەڕدا)، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان)، پەروەردگارا لێخۆشبوونی تۆمان دەوێت و سەرەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە).

خوای گەورە ئەرک ناخاتە سەر هیچ کەسێک، مەگەر بە قەدەر توانایی خۆی نەبێت، هەر کارێکی چاک ئەنجام بدات، قازانجی تەنیا بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکی کردبێت، تەنیا یەخەی خۆی دەگرێت و لەسەر خۆیەتی، (هەر بۆیە ئیمانداران دەڵێن:) پەروەردگارا؛ لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهـ و هەڵەیەکمان لە دەست قەوما، پەروەردگارا؛ ئەرکی سەخت و کاری گران مەدە بەسەرماندا، وەکو ئەوەی داوتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا، پەروەردگارا؛ ئەرکێک مەدە بەسەرماندا لە تواناماندا نەبێت، تووشی بەڵا و ناخۆشییەکمان مەکە توانا و هێز و هەناومان لێ ببڕێت، گوناهمان بسڕەوە و چاوپۆشی بکە لە هەڵە و تاوانەکانمان و دای پۆشە، (داواکارین) بەزەییت بێتەوە پیاماندا، ڕەحممان پێ بکە، هەر تۆ پشتوپەناو یاریدادەری ئێمەیت، جا بۆیە داوا دەکەین سەرمان بخەیت بەسەر قەومی کافر و خوانەناساندا.

(ئا بەو شێوەیە پەروەردگاری مەزن فێری نزای ڕێک و پێکمان دەکات، ئومێدە کە لێشمان وەربگرێت).

بیستەم

## خودایە دڵەکانمان هەڵنەگێڕیتەوە دوای باوەڕهێنانمان

﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴿٩﴾ ﴾ آل عمران.

(پەروەردگارا دوای ئەوەی کە هیدایەت و ڕێنموویبیت کردین، دڵەکانمان لامەدە لە ڕێگەی ڕاست و لە ڕەحمەت و بەخششی تایبەتی خۆت بەهرەوەرمان بکە، چونکە بەڕاستی تۆ بەخشندە و بەخشێنەری. پەروەردگارا بەڕاستی تۆ کۆکەرەوەی هەموو خەڵکیت لە ڕۆژێکدا کە هیچ گومانی تێدا نییە، بێگومان خوا (زاتێک نییە) کە بەڵێنی خۆی نەباتە سەر).

بیست و یەکەم

## خودایە دڵ و دەروونم فراوان بکە

﴿ قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴿٢٨﴾ ﴾ طه.

(پەروەردگارا سینە و دڵ و دەروونم ئاسوودە و گوشاد بکە. ئیش و کار و هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە. گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە، تا لە قسە و گوفتار و مەرامم تێبگەن).

بیست و دووەم

## خودایە خۆمان و نەواکانمان لە نوێژخوێنان بگێڕە

﴿ رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ
وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾ ﴾ إبراهيم.

(پەروەردگارا، خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی کە ئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی، پەروەردگارا، دوعا و نزام گیرا بکە، پەروەردگارا، لە خۆم و دایک و باوکم و ئیماندااران خۆش ببە، لەو ڕۆژەدا کە لێپرسینەوە بەرپا دەبێت).

بیست و سێیەم

## خودایە ڕزگارمان بکە

﴿ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ الشعراء.

(پەروەردگارا خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگار بکە لەو کاروکردەوانەی ئەوانە دەیکەن).

بیست و چوارەم

## خودایە سەرمان بخە

﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴾ المؤمنون.

(پەروەردگارا، سەرکەوتنم پێ ببەخشە، چونکە بڕوایان پێ نەکردم).

﴿ رَبِّ ٱنصُرۡنِي عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ العنكبوت.

(پەروەردگارە، سەرکەوتنم پێ ببەخشە بەسەر ئەم قەومەی کە تۆوی خراپە دەچینن).

بیست و پێنجەم

## خودایە وامان لێبکە سوپاسگوزاری نیعمەتەکانت بین

﴿ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَدۡخِلۡنِي
بِرَحۡمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩﴾ ﴾ النمل.

(پەروەردگارا، یارمەتیم بدە دڵ و دەروون و ڕۆح و گیانم کۆبکەرەوە، تا سوپاسگوزاری ناز و نیعمەتەکانت بم کە بەسەر من و دایک و باوکمدا ڕژاندووتە، هەروەها کۆمەکیم بکە تا کاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی ڕازیی بیت و بە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانتەوە).

بیست و شەشەم

## خودایە خۆگریی و ئارامگریمان پێ ببەخشە

﴿ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٥٠ ﴾ البقرة.

(پەروەردگارا خۆگری و ئارامگریمان پێ ببەخشە، (دڵ و دەروون و) پێکانمان دامەزراو بکە و سەرمان بخە بەسەر گەل و هۆزی بێباوەڕاندا).

بیست و حەفتەم

# خودایە مال شار و وڵاتمان بپارێزە

﴿ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ ﴾ البقرة.

(پەروەردگارا دەورووبەری ئەم ماڵەت بگێڕە بە شارێکی پڕ لە ئاسایش و ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆر ببەخشە بە دانیشتوانی، (بەتایبەت) بەوانەی باوەڕیان بە خوا و ڕۆژیی دوایی هێناوە. (خوای گەورە وەڵامی دایەوە کە دوعات گیرایە و) فەرمووی: بەڵام ئەوەش کافرە بێبەشی ناکەم لە بەرهەم و ناز و نیعمەتی کەم تەمەنی ئەم دنیایە، بەڵام لەوەودوا بە ناچاریی تووشی سزای ئاگری دەکەم کە سەرئەنجام و چارەنووسێکی خراپە).

﴿ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا ٱلۡبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ٣٥ ﴾ إبراهيم.

(پەروەردگارا، باڵی هێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شار و وڵاتەدا و خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرەستین).

بیست و هەشتەم

## خودایە نەوەی چاکمان پێ ببەخشە

﴿ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ٣٨ ﴾ آل عمران.

(پەروەردگارا نەوەی چاک و پاکم پێ ببەخشە، بەڕاستی تۆ بیسەری دوعا و نزایت).

﴿ رَبِّ هَبۡ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١٠٠ ﴾ الصافات.

(پەروەردگارا نەوەیەکی چاک و پاکم پێ ببەخشە).

بیست و نۆیەم

## خودایە کارەکانمان بۆ ئاسان و بەرەکەتدار بکە

﴿ رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ٨٠ ﴾ الإسراء.

(پەروەردگارا یارمەتیم بدە تا هەرکاتێك دەستبەکاری (هەرخێرێك بووم) بەچاکی و ڕاستی و دروستی ئەنجامی بدەم و لە هەرکارێك بوومەوە و ئەنجامم دا، سەرەنجامێکی چاکی هەبێت و بەجوانی لێی دەرچم و هەمیشە و بەردەوام لەلایەن خۆتەوە دەسەڵاتێکم پێ ببەخشە کە ببێتە هۆی سەرکەوتنی بەردەوامم).

سێیەم

## خودایە لە ئێمە و ئیمانداران خۆشببە

﴿ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ٢٨ ﴾ نوح.

(پەروەردگارا؛ لە خۆم و دایك و باوكم و ئەوانە خۆش ببە كە دێنە ماڵم؛ بە ئیمان و باوەڕەوە، هەروەها لە ئیماندارانی پیاو و ئیماندارانی ئافرەتیش خۆش ببە، ستەمكارانیش تەنیا تیاچوون نەبێت هیچی تر نەكەیتە بەشیان).

سی و یەکەم

## خودایە دانایی و دەسەڵاتمان پێببەخشە

﴿ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴿٨٣﴾ وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ ﴾ الشعراء.

(پەروەردگارا، زانیاری و دانایی و دەسەڵاتی تەواوم پێ ببەخشە و پەیوەستم بکە بە چاکەکارانەوە. پەروەردگارا؛ یادی خێرم با لەسەر زاری نەوەکانی داهاتوودا بمێنێت. بمگێڕە لەو کەسەناش کە بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەت بەدەست دەهێنن و دەبنە خاوەنی).

سی ودووەم

## خودایە بەتەنیایی مەمهێڵەوە

﴿ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ الأنبياء.

(پەروەردگارا؛ من بە تەنیای مەهێڵەرەوە (نەوەیەکی چاک و پاکم پێ ببەخشە) تۆیش چاکترین زاتێکی لە پاش من و هەموو مردوویەک دەمێنیتەوە).

سی و سێیەم

## خودایە لە گوناهەکانمان خۆشبە

﴿ وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١١٨ ﴾ المؤمنون.

(پەروەردگارا: لە گوناهو هەڵەکانم خۆش ببە و ڕەحمم پێ بکە چونکە تۆ لە هەموو میهرەبانان میهرەبانتریت).

سی و چوارەم

## خودایە زانست و زانیاریمان زیاد بکە

﴿ رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ١١٤ ﴾ طه.

(پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاری زۆرتر و زیاترم پێ ببەخشە).

سی و پێنجەم

## خودایە تەنیا پەنا بە تۆ دەگرین

﴿ رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ٩٧ ﴾ المؤمنون.

(پەروەردگارا من پەنا دەگرم بە تۆ لە هەموو خەتەرە و خەیاڵ و وەسوەسەی شەیتانەکان. پەنا دەگرم بە تۆ ئەی پەروەردگارم کە شەیتانەکان بەدەورمدا کۆ ببنەوە و (سەرم لێ بشێوێنن)).

